سەرچاوە

فصل في الجحيم

آرثر رامبو

ترجمة: رمسيس يونان

بيروت- لبنان ١٩٨٤

ناوی کتێب: وەرزێك لە دۆزەخ

نووسینی: ئارسەر ڕامبۆ

وەرگێڕانی: کەریم دەشتی

بابەت: شیعر

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ١٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن : (٨٨١)ی ٢٠٠٧

چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

کوردستان -سلێمانی

www.sardamco.com

ئارسەر ڕامبۆ

# وەرزێك لە دۆزەخ

وەرگێڕانی

**کەریم دەشتی**

سلێمانی- ٢٠٠٧

# پێرست

# وەرزێك لە دۆزەخ

لەوان ڕۆژانی ڕابردوو، گەر یادگا فیلم لێنـەکات، ئەوە زینـدەگیم داوەتێـك بـوو، تـەواوی دڵانـی تیـا دەکرایەوەو هەموو شەڕابێکی تیا هەڵدەڕژا.

*** 

ئێوارەیەکیان جوانیم خستەسەر ئـەژنۆکانم، بیـنم تاڵە، جنێوم پێـداو لـە دژی دادوەری خـۆم پـڕ چـەك کرد..

ڕام کرد، ئـەی سـیحربازەکان، ئـەی کـوێرەوەری، ئەی ڕقوقین، ئێوەن خەزنەی گەنجینەی من..

***

گەیشتمە ئەوەی کە هەموو هیواییێکی مرۆیی لـە دەروندا مەحو کەم . هەموو دڵخۆشـییێك بخنکێـنم و وەك وەحشێکی دڕندە قیت بوومەوە.

***

جەللادەکانم بانگ کرد تا لە کاتی فەنابوونی خۆمدا داری تفەنگەکانیان بکرۆژم.. بانگی بەڵایەکانم کرد تا هەناسەم بە لیم و خوێن ببڕن، نەگبەتیی خوداوەندم بوو، بەناو چڵپاودا ڕاکشام، بە بای تاوان خۆم وشك کردەوە و زۆر جارانیش شێتایەتیم لاواندەوە...

❋❋❋

بەهاریش جگە لەپێکەنینی گەلۆرێکی قێزەوەن هیچی بۆ نەهێنام.

❋❋❋

بەڵام لە زووێکەوە زانیم کە من ئەوەندەم نەماوە تادوا هەناسەم هەڵبکێشم، بیرم لەوە کردەوە کە بە دوای کلیلی داوەتی ڕابردووم بگەڕێم بەڵکو تاسوقی خۆم وەدەست دێنمەوە.

❋❋❋

خۆشەویستی ئەو کلیلەیە، ئەم سروشەیە دەیسەلمێنێ کە من خەون دەبینیم..

❋❋❋

(هەر بە کەمتیاری دەمێنێیتەوە...هتد) ئا بەم جۆرە شەیتان هاواری بۆ کردم، ئەو شەیتانەی بە گوڵە خەشخاشی جوان جوان تاجی لەسەر نام (بەهەموو

ئالودەو منایەتی خۆتەوە دەرك بە مەرگ بکـە، دەرك بە هەموو ئەو گوناهانەت بکە کـە لێخۆشـبوونی بـۆ نیە).

❊ ❊ ❊

ئاخ من زێدەتر لە بڕستم بەرگـەم گرتـووە، بـەڵام ئـەی ئیبلیـسی ئـازیز بـە تیـچاوێکی کـەمتر لێـت دەپاڕێمەوە لە چـاوەڕوانی هـیچ و پوچـیە پێـشبینی کراوەکانـدا، ئـەی ئـەو کەسـەی کـە ئـەوەت لـە نوسەرخۆشـدەوێ کـە ڕوت بێتـەوە لـە بـەهرەی وەسفکردن یا ڕێشاندەری، ئەو چەند ئەو کـەم لاپـەڕە ترسناکە لە سیپارەییێکی نەفرەت لێکراوی مەلعون بۆ تۆ دەردەکێشم.

❊ ❊ ❊

# دەمارێکی پۆخڵ

چـاوێکی شـینی سـپی و ئـەقڵێکی تەسـك و خورافەتی خۆم لەمەڕ کوشـتار، بـە مـیرات ئـەژدادە مەزنەکانمەوە بۆ ماوەتەوە، من وا دەبینم جلوبەرگم لە جلوبـەرگی ئـەوان چـی وەی کەمترنییـە لـە رووی بەربەرییەتەوە، بەڵام من قژم چەور ناکەم.

❊❊❊

ئەو مەزنانە لە چـاخی خۆیـان خـەڵکانێك بـوون کەمتر کارامەیی ئەوەیان هـەبوو کـە پێـستی ئـاژەڵ داکەلیێنن و گیاوگۆڵ بسوتێنن.

❊❊❊

هەر لەوانیشەوە وەسەنیەت و حەزی هەتك کردنی حەرامکراوەکانم وەرگرتووە، هەر ئـەوەش نـا بـەڵکو

هەموو ڕەزاڵەت و توڕەیی و شەبەقێکیشم وەرگرتووە، وای لە شەبەقە مەزنە؟ بەتایبەت درۆ و تەمبەڵی.

*** 

هەموو پیشەکان دەمترسێنن، گەورە و کرێکاران، هەموویان جوتێرن، عەیبدارن، دەستێکی قەڵەمدار ئەو دەستەی رابەری جووتە بە باشتر نازانێ لە هی خۆی، وای لەم سەدە دەستەکیە، دەستەکانم بۆ من نابێ! پاشان، گرتنە دەستی کارێ لە سنورێ ناوەستێ، ئەمانەتی سواڵکەران ئازارم دەدات، تاوانبارەکان وەك هێلکە گون قێزەوەنن، بەلاّم من نابێ.. هەموو ئەوانە لای من وەك یەکن.

*** 

بەلاّم! کێ بەغەدر وای لە زمانم کرد ، هەتا بۆ ئەمڕۆ تەمبەڵیمی ویست و پارێزگاری لێکرد. بەبێ ئەوەی لە پێناوی ژیاندا هەتا جەستەشم بۆ کارێ بخەمە گەڕ کە لە بێ کاری بۆق زیاترە، لەهەموو شوێنێ ژیاوم هیچ خانەوادەیێك لە ئەوروپا نەماوە نەیناسم.

*** 

مەبەستم لە خانەوادەکان، وەك خانەوادەی خۆمە، کە خۆی بە قەرزاری هەموو شت دەزانێ بۆ جاڕدانی مافی مرۆڤ، هەموو کوڕانی خانەوادەکانم ناسیووە.

*** 

وای ئەگەر لە هەر کاتێکی مێژووی فەرەنسا لە نێو خەڵکانی پێشین هی وەك من هەبان، بەڵام نا... هەڵبەت.

***

ئەوەی روونە من هەمیشە لە ڕەچەڵەکێکی داتەپیو بوویمە، تەمەرود سەر ئیدراکم دەکەوێ، ڕێ و ڕەچەڵەکی من ، بۆ تاراج کردن نەبێ هەرگیز تاوی نەداوە، گورگ ئاسا بووە لەگەڵ نێچیرەکەیدا کە قەت ڕاوی ناکات.

***

من مێژووی فەرەنسام لەبەرە، دامەزرێنەری یەکەمین کاتدرال، دەتوانم بەدرۆ بچمە حەجی زەوی موقەددەسەوە؟لەناو زەینمدا چەندین ڕێگا هەیە دەچێتەوە سەر دەشتایی باڤاریا، هەروەها چەندین وێنە لە بیزەنتە و قەڵاکانی ئۆرشەلیم.. تەسبیحکاری بە مەریەم، غەریبی کردن بەسەر خاچەوە، لە دڵمداو لە نێوەندی هەزاران جوانی دونیاییدا ڕادەبن.. من

بەمکورپیەوە بەسەر تاوە و گەلاّ هەلّپاچراوەکانەوە ڕونیشتووم، بەتەك ئەو دیوارانەوە کە خۆر خواردونیەتی ، لە توانامدایە بە دەربەردەری، لە ژێر ئاسمانی ئەلّمانیادا خۆم رووت کەمەوەو بچمە ئەو گۆڕەوە.

***

ئاخ. هەروەها: شەموان لە میهرەجانی جادوبازان لە مەیدانی سوورو لە ناوەندی گوناهەکان لەگەلّ پیرو منالاّندا سەما دەکەم.

***

زاکیرەم زیاتر لەم زەویە و لە مەسیحیەت بڕناکات.. هەرگیز تەواو نابم لەبینینی خۆم لەو ڕابردووەدا...

بەلاّم من هەمیشە تەنها بوویمە، بێ خانەوادە. بەلّکو نەمدەزانی بەکام زمانیش قسەدەکەم؟ قەت خۆم لە مەجلیسی مەسیح ئەندێشە نەکردووە، هەروەها لە مەجلیسی ئەرباب — نوێنەرانی مەسیح.

***

لە سەدەی ڕابردوودا چیبووم؟ تەنها ئیرۆکە بۆ خۆم بێدار بوومەتەوە، ئیدی درۆزنەکان و جەنگە نادیارەکان نەماون . ئەو ڕێ و ڕەچەلّەکە داتەپیوە

زەوی داپۆشیوە- گەل- وەك دەڵێن هەروا ئەقڵ و نەتەوەو زانستیشی داپۆشیوە.

*** 

وای بۆ زانست. هەموو شتێکیان سەر لە نوێ بۆ جەستەو ڕۆح دەست پێکردەوە- قوربانی موقەددەس- نوژداری و فەلسەفەمان هەیە... وەسفەی پیران و بالۆرەی میللی ریزو پۆلبەندکراون، هەروەها تەسلیاتی ئەمیرەکان و ئەو یاریانەی حەرامیان کردووە، جوگرافیا،کەسموجوگرافیا، میکانیکا. کیمیا، زانست، حسێبی نوێ، پێشکەوتن، دونیا دەڕوا، ئەی بۆ ناسوڕێ؟

*** 

ئەوە خەونی ژمارەکانە. ئێمە بەرەو ڕۆح دەچین، ئەوە موحەققەقە. ئەوە پێغەمبەرایەتیە، ئەوەی دەیلێم. من تێدەگەم. بەڵام کە ناتوانم بەبێ دەستەواژەی وەسەنی گوزارشت بکەم. بێدەنگیم ویستووە.

*** 

خوێنی وەسەنی دەگەڕێتەوە، ڕۆح نزیك دەبێتەوە، ئەدی بۆ مەسیح پاڵپشتم ناکا بەوەی کە نوبل و

ئـازادیم پێبـدات؟ بـەڵام بەداخـەوە، ئیـدی ئینجیـل بەسەرچوو.. ئینجیل.

*** 

بەتاسوقەوە چاوەڕوانی خوداوەند دەکەم، من هـەر لە ئەزەلەوە لە ڕەچەڵەکێکی داتەپیوم.

*** 

هـا ئـەوە مـن لـەو پـەڕی فەرەنـسام، دەبـا ڕووناکیـەکان لـە شـاراندا داییـسێن. ڕۆژی مـن بەسەرچوو؟

*** 

ئـەوروپا جێـدەهێڵم، هـەوای دەریـا سـییەکانم دەسوتێنێ. پێستی مـن هێمـا بـۆ خـۆری غـەریبگا دەکا. ئیدی سەردەکەوم و گیا دەخۆم و ڕاودەکەم، بـە تایبـەتیش جگەرەدەکێـشم؟ مـەیێکی داگیرسـاو هەڵدەهێنجم وەك مەعدەنێکی کولاو. هەروەکو چـۆن ئەژداودم بە دەوری ئاگردا وایان دەکرد.

*** 

بـە چـەند باڵێـك لـە ئاسـن دەگەڕێمـەوە، بـە پێـستێکی ڕەشـو گلێنەیـەکی بـە گـوڕەوە هـەر لـە ڕوخـسارمدا حـوکمی ئـەوە دەدەن، کـە مـن لـە بنەچەیێکی بەهێزم، زیڕم دەبێ، خۆشی لـە بۆشـایی

وەردەگرم، دەکوژم و دەبڕم، ژنانیش بۆ ئەو پەك خراوە درندانەی لە ولاتـە گەرمەکانـدا گەڕاونەتـەوە کـوورِ دەبنەوە، ئیدی من دەسـتێکم دەبـێ لـە سیاسـەت و ڕزگاریم دەبێ.

*** 

بەڵام ئێستێ نەفرەتم لێبێ، من لە وڵات دەترسم، لە خەوتنی سەرخۆشێ بەسەر کـەناری دەریـاوە هـیچ شتێکی تر بۆ خۆم بە باشترم نازانم.

*** 

هیچ کۆچێ لە ئارادانییە.. دەبا بگەڕێمەوە ئـەو شوێنەی لێی هاتووم، بە خۆو بـە بـاری گوناهـەکانم، ئەو گوناهانەی کە ڕەگاژۆ بوونەو ئازاریـان هێناوەتـە تەکمەوە، هەر لەو کاتەوە کە باڵقبووم، ئەو گوناهەی کە بۆ ئاسمان هەڵدەکـشێ، دەمـشکێنێ و دەمخـات و پەلکێشم دەکات، بەرماوێك لە بەرائەت و پاشماوێـك لە ترس، واگوتراوە، نابێ قێزەوەنـی و پڕوپوچـیم بـۆ دونیا بخەمە کۆڵ.

*** 

دەبا بەرەو پێشەوە بچین. بارەکە بگرینە ئەستۆ و بەرەو بیابان و بێزاری و وەڕسی بەڕێ بکەوین.

*** 

خـۆم بدەمــە کــێ بــە کــرێ؟ دەبــێ چ دەواەرێ بپەرســتم؟ دەبــێ هێــرش بەرمــە ســەر چ وێنەیــەکی موقــەددەس؟ چ دڵانێــك وێــران بکــەم؟ خــۆم بــە چ درۆیەکەوە بگرم؟دەبێ لە چ خوێنێکەوە بڕۆم؟

*** 

باشتر وایە خۆم لە عەدالەت بە دوور بگرم، ژیانی دژوار و جرپن، هەرئەوەش نــا بــەڵکو بــە دەســتێکی لاوازەوە سەرپۆشی تابوت هــەڵگرم، خــۆم پــەنادەم و بخنکێم، بۆیە من پــیری و مەترســی نــازانم. تۆقانــدن شتێکی فەرەنسی نییە.

*** 

- ئاخ! من وام لە ڕوو زەردی، تا وام لێ هــاتووە بۆ هەر وێنەیەکی موقەددەس شەوقی کەماڵم ڕابخەم.

وای بۆ قوربانی دانم، وای بۆ مەحەببەتی مــەزنم، لەگەڵ ئەوەشدا لەو دونیــا **De Profundis Domine**...

وای چەند گەلۆرم.

*** 

کە من هێشتا منداڵم سەرسام بووم بەو سەرکێشە پیلــەکارە، کەهێــشتا دەرگــای مەعقەڵــەکانی جــێ نەهێشتووە، ســەر لــە نــوێ بەســەریا دادەخرێتــەوە؟ مەیخانە و ئەو هوتێلانەی کە ڕەنگە بە قامەتی خــۆی

پیرۆزی کردبن زیارەت کردووە، هەر بە بیرۆکـەی ئـەو ئاسمانی شین و کاری گەشاوەی کێڵگەکانم بینیوە؟

*** 

بۆنی ئەو نەگبەتیەم هەڵکێشاوە کە دەوری ئەویان داوە لە شارەکان، لە ڕووی هێزەوە باڵاترە لە قدیس و لە ڕووی سەفەرکردنەوە لـە قـدیس کارامــەترە، ئـەو بەڵێ ئەو تەنها شاهێدی حیکمەت و شانازییێتی ئەوە.

*** 

لە شەوانی زستاندا بێ پەناو بێ جل و و بێ بـژێو ڕادەبم، گوێم لە دەنگـێ دەبـێ کـە دڵـی بەسـتەڵەکم دەگرێ (ئایا ئەوە بێ هێزییە یا هێـزە؟ بیگـرە ئـەوە هێزە. تۆ نازانی بۆ کوێ و یا لە پای چی رادەبـورێ، سەر بە هــەموو دەرگاکـان دەکـەم، وەڵامـی هـەموو هاواڕێ دەدەمەوە، تۆ هیچ شتێ ناکوژی زیـاتر لـەوە کە تۆوەك گڵکۆییێکی کپیت). لە سپێدەشدا، هەردوو گلێنەم لە وێڵی و ڕوومەتم لە زەردی، هەتا لەوانەیـە ئەوانەش منیان نەبینیبێ کە دیدارم کردوون .

*** 

لە شارەکاندا لـەناکاودا چـڵپاوەکان وا بـۆمن بـە دیارکەوتن کە سوور و ڕەش بن، وەك ئاوێنەیێ کـاتێ کە چرا لە ژوورەکەی تەکما دێت و دەچـێ، یـا خـود

وەك گەنجینەیێ لە دارستان، هاوارم کرد: بەختم چەند خۆشە، بە ئاسمانیشەوە دەریاییێ لە گڕو دەوکەڵم بینی لە ڕاست و چەپەوە هەموو خێراتەکان، وەك ملیۆنێ لە هەورەتریشقە دەسووتان و هەڕەشەیان دەکرد.

***

کەچی من لە قەسف و هاوەڵێتی ژنان مەحروم بوومە، هەر هیچ هاوەڵێکم نییە، خۆم لە بەردەم ئاپۆڕەییێکی هەڵچوودا بینی لە بەردەمیشما جۆقەی جەللادەکان؟ بۆ ئەو بەڵایە دەگریام کە نەیاندەتوانی تێی بگەن و لەوانم بووری. وەك (ژان دارك) ئەی کاهین و ئوستاد و گەورە پیاوان، ئێوە تووشی زەلالەت دەبن کە من دەدەن بە دادگا. من قەت لەو- گەلە- نەبوویم؟ قەت مەسیحی نەبوویم؟ بەڵکو من لەو بناوانەم کە لەکاتی میحنەتدا گۆرانی دەڵێ؟لە یاساکان ناگەم؟ بە خیلقەت هیچ هەستێکم نیە، من وەحشێکی هەمەجیم: قسە دەکەم تا تووشی زەلالەت بن!

***

بەڵێ چاوی من لە نوری ئێوە داخراوە، من وەحشیم. من بەربەریم، بەڵام دەکرا ڕزگارم بێ، وەلێ ئێوە چەند بەربەرییێکی قولابین... ئێوە گێل و دڕندەو

فێڵکارن، ئەی بازرگانەکە تۆ بەربەری؟ ئەی قازی تۆ بەربەری، ئەی ڕابەر تۆ بەربەری، ئەی تزار ئەی بەڵەکی کەڤنار تۆ بەربەری و لەشەرابێکی قاچاغت خواردۆتەوە کە شەیتان دورستی کردووە- تا - و شێرپەنجە ئەم گەلە لە پێستی خۆی دەبەنە دەرەوە.

❊ ❊ ❊

پیرو رونیشتووەکان لە ویقارێکی وان و بانگی سەلەفی خۆیان دەکەن، کارامەترین بیرورا ئەوەیە کە لەو قارڕەیە دابەزم کە کەودەنی بە دوای بارمتەکاندا دەگەڕێ بۆ ئەو ئەشقیایانە. ئەوا من چوومە ناو مەملەکەتی هەققی کوڕانی حام.

❊ ❊ ❊

ئایا هێشتا سروشتم ناسیوە؟؟ ئایا خۆم دەناسم؟ پڕگۆیی بەسە، من مردووەکان لە هەناومدا دەشارمەوە، هاوارەکان، دەهۆڵەکان، سەما، سەما، سەما، سەما! هەتا ئەو کاتەش، کاتی دابەزینی سپیەکان بۆ دەشتایی هیچ نابینم کە دەکەومە ناو عەدەمەوە..

❊ ❊ ❊

برسیەتی، تێنوێتی، هاوار، سەما، سەما، سەما، سەما.

*** 

سـپییەکان دادەبـەزن، مـەترەلۆزەکان، دەبـێ بخزێینە ژێر باری عومدەکان، جلوبەرگ و کار.

*** 

ئەوا بەرەکەتی ئاسمان هاتە ناو دڵمەوە، ئاخ مـن پێشبینیم نەدەکرد!

*** 

قەت شەرم دروست نـەکردووە، ڕۆژەکـانم خـۆش دەبن، ئیدی من پێویستم بە تۆ نییە. تازە ئازاری ئەو دەروونە نیمچە مردووە بـەڕوی خێـردا ناکێـشم، کـە نـورێکی توندوتیـژی وەك مۆمـەکانی جـەنائیزی لێ هەڵدەستێ، چارەنووسی یەکێ لە کوڕی خانەوادەکان، تـابوتێکی پـێش وەختـە، فرمێـسکێکی بریقـەدار دایدەپۆشـێ، قـسە لـەوەدا نییـە کـە هـەراو زەنـا گەمژەڵییە... گوناهیش گەمژەڵییە؟ هەر دەبێ گەنیو تورهەڵـدرێ، بـەڵام نـاقوس نـاتوانێ لێـدانی خـۆی بوەستێنێ، تا ئەو کاتەی کە سـەعاتی ئـازاری ڕووت لێدەدات، ئایا دەبێ من وەکو منداڵ هەڵگرن تا یاری لە بەهەشت بکەم و غافڵبم لە هەموو ئەو ئازارانە!

*** 

پەلەکەن، ئایا چالاکییێکی دیکە نییە؟ ڕاکشان لە نێوەندی سەروەتمەندیدا مەحاڵە، سەروەت هەمیشە موڵکێکی مەشاع بووە، تەنها خۆشەویستی خوداوەندی کلیلی زانست دەبەخشێ، من سروشت بەدی ناکەم، تەنها دیمەنێکە بۆ خێر، دە ماڵاوا ئەی تارمایی و ئۆڵگوکان و باتیلەکان.

❊❊❊

سترانی ئەقڵمەندی فریشتە لە نێو کەشتی نەجاتدا بەرز دەبێتەوە، ئەوە ئەڤینی خوداوەندییە، دوو خۆشەویستییە، ڕەنگە دەمرم لە خۆشەویستی دونیایی، بە خۆبەخت کردنەوە دەمرم، چونکە کەسانێکم جێهێشتووە کە خەمەکانیان قورس دەبێ سەبارەت بە فیراقی منەوە، لە نێو خنکاوەکاندا منتان هەڵبژارد؟

ئەدی ئەوانەی دیکە هاوڕێم نەبوون؟

❊❊❊

دەبا زرگاریان کەن!

❊❊❊

ئیدی تەژی بووم لە هیدایەت، دونیا خۆشە، ژیان پیرۆز دەکەم، براکانم خۆشدەوێن، ئەوەشیان وادەی منالێ نیە، هیچ ئاواتێك نییە بۆ دەربازبوون لە پیری و

مەرگ، خودا سەرچاوەی هێزی منە، من بە ناوی خودا پەرستش دەکەم.

* * *

چیدی بێزاری و تورەیی و هەرا و زەنا و شێتی و ئەو شتەی کە پەیم بە تاسوق و بەڵایەکانی بردووە ئەڤینی من نین، هەموو بارێکم دانا، دەبا بەبێ سەرسوڕمان قەدری مەدای بێگوناهیم بکەین.

* * *

ئیدی لە توانامدا نەماوە تکای دڵدانەوە بکەم لە سۆنگەی ئەوەی بە کە دار عەسا لەبنی پێم دەدرێ، وا زەن ناکەم من لە ڕێی شەوی زاوایەتی بم و مەسیح باوکی بوکی من بێ.

* * *

من دیلی ئەقڵی خۆم نیم، گوتم خودایە من ئازادیم لە خەلاص دەوێ، چۆن بیگەمێ؟ خۆم لە مەیلەکانم ڕەهاکرد، ئیدی لەمەولا پێویستم بە پەرستن و خۆشەویستی ئیلاهی نییە، هیچ حەسرەتێکم بۆ کوشینی دڵە نەرمەکان نییە، هەموو هەرێمێ رق و مەحەببەتی خۆی هەیە: من پایەی خۆم لە ترۆپکی ئەو پەیژە فریشتەییە دەپارێزم، پەیژەی ئەقڵ و ڕوشد.

* * *

بەڵام بەختەوەری سەقامگیر و ماڵ یا هیتر، نا ئەوە ناتوانم من زۆر پەرش و بڵاوم. زۆر بێ هێزم.ژیان بەکارەوە سەرهەڵدەدا، ئەوە هەر لە کۆنەوە حەقیقەتێکی دیارە، بەڵام ژیانم قەراری بۆ نییە، دوور دور بەسەر ئیش و کارەوە دەفڕێ و سەر ئەو پنتکە ئازیزە لە دونیا بەرز دەبێتەوەبە.

*** 

لەبەر ترسی مردن، وای چەند لە ناکامیێ دەچم .

***

ئەگەر خودا کپی ئاسمانیی و ئەپیری نوی وپێ بەخشیبام، هەروەك قەددیسەکانی پێشین. قەددیسەکان! وای چەند بەهێزن! ڕەبەنەکان وای لەو سەلالە لە هونەرمەندان، کە خێرە ئەگەر ببڕێنەوە.

***

مەهزەلەیەکەو نابڕێتەوە، ئەوەندەی نەماوە بەڕائەتیم بگرێنێ، ژیان مەهزەلەیەکەو ئەبێ هەموو بیچنین.

بەسە. ئا ئەوە سزاو تۆڵەیە. بۆ پێشەوە.

***

ئــاخ ئــەوە ســـییەکانم دەســـوتێن و لاجــانگم ورتەورتیانە! شەویش لە ناوەندی ئــەو نیوەڕۆیــەو لــە ناوەندی دڵدا چاوم تاری دەکا. پەل و پۆم...

* * *

بۆ کویێ دەچین؟ بۆ جەنگ؟ بەڵام من هێزم ڕماوە.
ئەوانی دیکە دەچنە پێش... کەلوپــەل، چــەك و تفاق... زەمان!

* * *

گوللە، بە گوللە لێمدەن، لێرە. دەنا خۆم تەســلیم دەکەم، وای بۆ ترسنۆکان- خۆم دەکوژم. خۆم داوێمە ژێر سمی ئەسپ

* * *

ئاخ
ـ ئیدی لەوە ڕادێم
ئــەوەیان ئیــدی زینــدەگی فەرەنــسیە... ڕێگــای شەڕەفە.

# شەوی دۆزەخ

چەند قومێکی هێجگار زۆرم لە ژەهر هەڵقوڕاند، دەبا سێ جاران ئەو ئامۆژگارییە پیرۆزکات کە کردوومەتە دیاری ئەو، وا هەناوم دەسووتێ، توندوتیژی ئەو ژەهرە پەلوپۆم لولدەدا، دەمشێوێنێ، من لە تێنوان دەخنکێم، ناتوانم هاوار بکەم، ئەوە دۆزەخە دینونەی ئەبەدییە، سەیرکە چۆن نێڵەی ئاگر هەڵدەچێ، من وەك چۆن دەبێ ئاوا دەسووتێم، وای تۆ چەند شەیتانی!

❊❊❊

من وام پێشبینی دەکرد بچمە سەر خێر و خۆشی و ڕزگاری، ئایا وەسفی خەونی خۆم بکەم، وەلێ کەشی دۆزەخ بەرگەی تەرتیلان ناگرێ، خەیاڵی مەلایین مەخلوقاتی جوان و مۆسیقای بە تامی

ڕەوحانیـــەت و هێـــز و ئاشـــتی و ئـــارەزووی پـــاکم کردووە،ئیدی نازانم چیتر. ئارەزووی پاك!

❊ ❊ ❊

هێشتا لە ژیاندایین! جا ئەگەر نەفرەتەکە ئەبـەدی بێ، ئەوە ئەگەر کەسێ گەرەکی بـێ خـۆی بـشێوێنێ کەسێکی بەڕاستی مەلعونە، وانییە؟؟ من وام باوەڕە کە لە دۆزەخم، کەواتە من لـە ناویامـە، بـەم جـۆرە ئەوەی کە لە ڕێنماییە موقەددەسەکانەوە هاتووە دێتە کایەوە. من دیلی مەعمودیەتی خۆمم، ئەی بـاوك و دایکم ئێوە عیللەتی نەکبەتی من و خۆتـانن... وای لە منی بی گوناهی هەژار!

❊ ❊ ❊

ئاگر تەعەددا لە پەرستیارانی بت ناکات.

❊ ❊ ❊

- هێـــشتا لـــە ژیـــان دایـــن! پاشـــان لـــەزەت بەخشەکانی دەینونەت بە قووڵایی دادەچن. پەلەکەن، بە تاوانێك یارمەتی من بدەن، تا بـەپێی شـەریعەتی مرۆڤ بکەومە ناو عەدەمەوە.

❊ ❊ ❊

بێ دەنگ بن بەڵێ بـێ دەنـگ! ئـەوە نـەنگی و توندوتیژییە لێرە: ها ئەوە شەیتانە دەڵێ، ئاگر کرێتە

و سورەتی تووڕەیی من گەلۆرییێکی ترسناکە- بەسە! چەند ئەباتیلیێکە پێیەوە دەمخاتە دوو دڵی، هەروا پڕوپوچی و عیتری قولابی و ئاوازی منالانەیە، هەرچەندە من پەی بە حەقیقەت دەبەم... عەدالەت بەدی دەکەم، بەڵام حوکمێکی ساغی بێ چەندوچوونم هەیە، ئامادەشم بۆ کەمال، شانازی و غرورە، پێستی سەرم وشك دەکات، خودایە ڕەحمەتت، من دەترسم،تێنومە و هێجگار زۆر تێنوومە، بە تاسووقەوەم بۆ ڕۆژانی منالّی و گیا و گوڵ و بەرەکەتی سەر بەردان و تیشکی مانگ لەو کاتەی ناقوسی سەعات دوانزە لێدەدا، شەیتان لەو سەعاتەدا لە ناو بورجی ناقوسدایە. ئەی مەریەم. ئەی پاکیزە.

****

ـ وای بۆ ئەو گەلۆرییە قێزەوەنەم .

****

لەوێ، ئایا ئەوان چەند نەفسێکی شەریف نین کە خێریان بۆ من دەوێ؟ وەرن، دەمم داخراوە... ئەوان نامبیستن... بەڵکو ئەوان تارماین... ئینجا هیچ کەسیش بیرلەوەی دی ناکاتەوە. نزیك مەکەونەوە، من بەبۆنی برژان هەڵدەچم، گومان لەوەدا نییە.

****

هەڵوەسەکان سنوریان بۆنییە. ئـەوەش هەمیـشە نەسیبی من بووە: باوەڕنەمانم بە مێژو و لـەبیرکردنی ڕێباز، هەموو نهێنیەکی خۆم ئاشکراناکەم: تا شاعیر و خودان دیدگاکان حەسوودیم پێ نەبەن. مـن سـەدان جـار دەوڵەمەنـد تـرم ، دەبـا وەك دەریـا ڕازگـر و دەستبگر بین.

❊❊❊

سەیرە، رەوڕەوەی ژیان وەستا. لـە دونیـادا نـیم-لاهوت فشە نییـە، دۆزەخ بەڕاسـتی لـە خوارەوەیـە، ئاسمان لە سەرەوەیە- نەشوەت، کابوس، خـەوتن لـە هێلانەیەك لە ئاگر!

❊❊❊

وای بۆ زیرەکی خـەڵکی گونـدان لـە بێـداریان.. ئیبلیس، ئەی فەردیناند.. ئیبلیس بە تۆوی وەحـشی قاچەکانی بۆ با دەکاتەوە،، مەسیح بەسـەر درەختـی سوری مورتکەوە دەڕوا بێ ئـەوەی بیپلیـشێنێتـەوە، بەسەر ئاوە هەڵچوەکاندا چوو، بە وەسـتاوی چـراکەی بـە ئێمـە نیـشاندا... سـپی بـەخۆو بـە کـەزی ڕەشتاڵەی|.. بەسەر لایەکی شەپۆلی زومەردییەوە..

❊❊❊

ئیدی هەموو نهێنییەکان کەشف دەکەم: نهێنی ئایینی یاسروشتی، مردن، لە دایکبوون، ئاییندە، ڕابردوو، کەون، عەدەم، من ئوستادی هونەری جادوم

*** 

گوێبگرن لێم!..

هەموو بەهرەیەکم هەیە!- کەسێ لێرەو لەوێ نییە: نامەوێ گەنجینەکەم پەرش و بڵاوبکەمەوە- گۆرانی زنجیتان دەوێ، پەرییەکان سەما دەکەن؟ دەتانەوێ لەبەر چاوان وون بم،من نقووم بۆ گەڕان بەدوای ئەموستیلەکە ؟ دەتانەوێ ؟ دەتوانم زێڕ و دەرمانی شەفا بەخش دروست بکەم.

*** 

دەبا باوڕتان بە من بێ، باوەڕ دڵنەوایی دەبەخشێ و ڕێ نیشان دەداو چاك دەکاتەوە. هەمووتان وەرن- هەتا منالآنیش... تا دڵتان بدەمەوە و دڵی خۆمتان بۆ بەخەرجبدەم،- دڵی مەزن!

*** 

هەژارەکان، کرێکاران! داوای نوێژتان لێ ناکەم، باوەڕی ئێوەم بۆ بەسە تا بەختەوەر بم.

*** 

ـ منتان لە بیربێ، تا حەسرەت بۆ ئەو دونیایە نەخۆم، بەختی خۆمە کە ئازارم زۆرتر نابێ، بەداخەوە ژیانی من جگە لە هەڵەشەیی و کەودەنی هیچی دیکەنییە...

❊ ❊ ❊

ئۆف.... دەبا بەهەمووتوانایەکی خەیاڵی ناوشەکان، دەمو چاومان گرژومۆن کەین.

❊ ❊ ❊

ئاشکرایە ئێمە لە دەرەوەی دونیایین. دەنگێ نییەو حاسەی بەرکەوتنم لە دەست داوە، بەداخەوە! بۆ کۆشك شار و دارستانی سنەوبەرم بەداخەوە! بۆ نیوەڕۆیانو شێوان و شەوو ڕۆژان..وای بۆتەمبەڵیم !

دەبوایە لەبری تووڕەییم دۆزەخم بەرکەوێ، لەبری خورتیشم دۆزەخ- جگە لە دۆزەخی شەهوەت، جۆقەیەك لە ڕەنگی دۆزەخ.

❊ ❊ ❊

من لە بێ هێزیان دەمرم. ئا ئەوە گۆڕە، من دەچمە لای کرمەکان، وای لەم قێزەوەنییە! ئەی شەیتان... ئەی بەدگۆ، دەتەوێ بە سیحرەکەتەوە شۆڕبیتەوە ناو گیانم ، من داوادەکەم، من داوای وەشانی شەنەیەك ، یاخود دڵۆپێ ئاگر دەکەم.

❊ ❊ ❊

ئاخ... گەڕانەوە بۆ ژیان! تـا بـە چـاوی خۆمـان عـەورەتی خۆمان بەدی کەین، پاشانئەو ژەهرە... ئەو ماچە نەفرەتیە. نەفرەتیە.

❊ ❊ ❊

وای بۆ بێ هێـزیم، وای بـۆ تونـدو تیـژی دونیـا! خودایە ڕەحمەتت، بم شارەوە جڵەوەی خۆم لـە دەسـت داوە! من خۆم حەشار داوەو شاراوە نیم.

❊ ❊ ❊

ئەوە ئاگرە دادەگرێ و کڵپە دەکا نەفرەتیەکەشی لە هەناویایە.

❊ ❊ ❊

# وڕێنە

**پاکیزەی هەڵەشەو**
**کەڵی دۆزەخ.**

گوێ رادێرن بۆ دانپیانانی یەکێ لـە هاوەڵـەکانی دۆزەخ:

"ئەی کەڵی ئاسمانی،خوداوەندی مـن، دانپیانـانی خەمبارترینی خزمەتکارانی خۆت رەت مەکەوە. مـن گومڕام. سەرخۆشم،من پۆخڵم. دەك دارزێ لە ژیان!

❊❊❊

(ببورە ئەی خوداوەنـدی ئاسمـانی، ببـورە!ببـورە! چەند فرمێسکم هەڵڕژاندوە ! چەند فرمێـسکێکی دی هەڵدەڕێژم، سەبارەت بەوەی کە تکای بۆدەکەم)

❊❊❊

(پاشــان ئــەو کەڵــە ئاسمانییــە دەناســم، بــە ژێردەستایەتی ئەو لە دایك بووم).

ـ بەڵام ئێستا ئەو کەڵەی دی دەمزریوێنیٚ!

***

(من ئێستاکە هاوڕێکانم لەناو دونیام! هاوڕێکانم! نەخێر، ئێوە هاوڕێم نین. قەت ئەو جۆرە وڕێنەو ئــەو ئازارەم نەدیوە. وای لەم گەلۆرییە!

***

(ئاه.. من ئازار دەکێشم، هاواردەکەم.. بەڕاستی من لە ئازاردام. لەگــەڵ ئــەوەش شــتیٚ نــەماوە پێــی بشلەژێم، منــی گــران و ســەنگین بــەرقی شــایانترین کەسیٚ بەرق .

***

باوابیٚ! ئێستیٚ با رازی خۆمتان بۆ ئاشکرا بکەم، هــەتا ئەگــەر ناچــاریش بم دوای بیــست کــەڕەتیش بگەڕێمەوە لای ئەو، ئەوە هەر ئەوە لــە خــەمباری و پروپوچی خۆیدا!

***

"من نەتەوەی کەلّی دۆزەخیم، ئەوەی کە پــاکیزە هەڵەشەکانی هیلاك کــردووە، هــەمان ئــەو شــەیتانە خۆیەتی، شەبەنگ نیە، تارمایی نیە، بەڵام مــنم کــە

ئەقڵم وون کردووە، منی نەفرەت لێکراوی هیلاك بوو لــە نــەزەری دونیــا، کــەس نــاتوانێ بمکــوژێ، چــۆن وەسفتان بۆ بکەم! هەتا قودرەتی قــسەکردنم نــەماوە، من لە پرسەدام، بەترسەوە دەگریم، شنەیێ لە هــەوا، خودایە ئەگەر ڕێگەم بدەی، بە فەزڵی خۆت!

***

"مــــن بێـــوەژنم...- مــــن بێوەژنبـــووم...- بەڕاستیمە بەڵێ سەبارەت بەوەی کەرابرد من جیدیمە، من بۆ ئەوە لە دایك نەبوویمە تا ببمە گردەپۆك! بەڵام ئــەو هێــشتا منالّــە، بــەڵام لوتفــە نادیارەکــانی هەڵمدەخەڵەتێنێ، هــەموو ئــەرکی مرۆڤایــەتی خــۆم لەبیر کردو بەدوای کەوتم... وای بۆ ئــەو لــەو ژیانــە! ژیانی هەق بەسەرچوو، ئیدی لەدونیانین، من دەرۆم بۆ ئەو شوێنەی کە ئەو دەچێ، ئەوە واجبە.. زۆر جاران لەمن توڕە دەبێ ، منی هەژار... وای لەو شــەیتانە! ئەوە شەیتانە ئەگەر بزانن، مرۆڤ نیە...

***

پێی گوتم:"ژنم خۆشناوێ: خۆشەویستی وەك چــۆن دەزانین دەبێ سەر لــەنوێ دابهێنرێتەوە،ئــەوان ژنــن، هیچیان پێ نــاکرێ جگــە لــە ئــارەزوی بارەگــاێیکی ئەمین، ئەگەر خەمباربوون ئــەوە لــە خۆشەویــستی و

جوانی غافڵدەبن، هیچی دیکە نەماوەتەوە جگە لە جەفای قێزەوەنی، زەخیرەی زەماوەندی ئەوروژگارە،یا ژنان دەبینم کە خۆشییان بەسەر ڕوخسارەوەیە، ژنانێ کە من دەتوانم،ببیانکەمە بە خێرترین هاوەڵ، یەکەمجار وەحشیەکان ئەوانەی کە شعورێکی ئاگرینی هەڵوشێنەری زەندەیقیان هەیە هەڵیان دەدڕن.

***

(گوێی لێ ڕابگرە کە نەنگی دەکا بە شانازی و توندو تیژی دەکا بەسیحر:

من لە بنەچەیێکی دوورم، ئەژدادم لەوپەڕی باکورن،تەنکێشی خۆیان شەق دەکرد و خوێنی خۆیان دەخواردەوە- ئیدی جەستەم پڕ لە برین دەکەم و ب کوتین دایدەپۆشم،تا وەکو مەغۆلێ بم لە کرێتی،ها دەبینی‌لە ناو ڕێگاکاندا دەوەڕم، دەمەوێ بەزەناوە شێتبم، نەکەی خشڵ نیشاندەی، ئەگینا بەسەر جێگەوە ڕادەکێشم و لولدەخۆم، سەروەتی خۆم دەوێ کە شەلالێ خوێن بێ و قبوڵی کارناکەم) زۆرجارن شەومان بەیەکەوە بەسەربردو شەیتانەکەی بەسەرما زاڵ بوو، منیش لەگەڵیا بەشەڕ دەهاتم- زۆرجاران لەناوەندی ڕێگاو هەوارەکان بە خۆماری دەوەستاو نەدەجولا، تا ترس لەناو دڵما بوروژێنێ. _(بەڕاستی

ملم پەل دەدەن، بەڕاستی ئەوە قێزەوەنە) وای لەو ڕۆژانە کە دەیەوێ بە تریفە تاج بارکراوی کۆستێرەکانەوە بڕوات!

** * *

(جار جارە بە لەهجەییێکی نەرم قسەم لەگەڵدا دەکات، سەبارەت بەو مەرگەی پەشیمانی لەدوایە، دەربارەی ئەو بێ خێرەی کە هیچ گومانێ لە وجودیا نیە.. هەروەها دەربارەی کاری قورس و فیراقێ کە دڵ هەڵدەپاچێ، لەبارەکانیش کە شەرابمان دەخواردەوە، دەگریا لەو کاتەی لە دەوروبەرمانا کرێشمەی کوژراوەکانی دەستی کڵۆڵی دەکرد، دەستی ئەو سەرخۆشانەی دەگرت کە لە ڕێگا تاریکەکانا ساتمەیان دەکرد، سۆزی هەبوو بۆ منداڵە بچووکەکان، سۆزێکی وەك سۆزی دایکە مەکرۆکان ئینجا لە ساتی نوێژدا بەنەرم و نیانی منداڵان گوزەری دەکرد.

* * *

ـ وای نیشاندەدا کە ئاگای لە هەموو شتە، بازرگانی و هونەر و نوژداری.

* * *

ـ منیش بەدوای دەکەوتم وەك چۆن دەبوو وابێ..

* * *

"من ئەو ئەو زەخرەفەم دەدیت کە ئەو کۆی کردبۆوە، لە خەیاڵدا، لە دەوروبەری: جلوبەرگ و توحەفیات و فەرش، بەڵکو هەر بە خۆم چەکێك و ڕوخسارێکم لێ داکەلاند، من هەموو ئەوانەم دەدیت کە دەستی دەدایە، بەو شێوەی کە دەیوست بۆخۆی خەڵقی بکات، کە خەیاڵم ماتەڵ دەبوو، من بەدوای دەکەوتم و چاودێریم دەکرد، لە چەند کارێکی ئاڵۆزو سەمەرە، باش یا خراپ بێ ئومێد بووم لەوەی بچمە دونیای ئەوەوە، شەوانە چەندین سەعاتم بەسەر بردوە بە دیار جەستە ئازیز و خەوتووەکەی. سەبارەت بەو شتەی کە ئەو پاڵنەرە ڕای دەدا بۆ ڕاکردن لە واقیع پرسیار لە خۆم دەکەم، مرۆڤ قەت خۆی ئاژیر نەکردۆتەوە بۆ ئەوەی کە خودی خۆی بۆ نەزر کردوە، دەرکم پێکرد بێ ئەوەی لەشتێ بترسم، لەوانەیە چەند گوتارێکی بەرزین لەمەر کۆمەڵەوە، ڕەنگە سرێکی هەبێ کە دونیا دەگۆڕێ، بەڵام بەخۆم گوت نەخێر، بەڵام ئەو بەدوایا دەگەڕێ، موحەبەتی ئەو مەسحورە، منیش دەرونم هیچی بۆ نیە جگەلەوەی خودان هێزبێ، هێزی بێ ئومێدی- کافیە بۆ بەرگەگرتنی، تا باڵی بەسەریا بکێشێ و بەئەڤینی خۆی لولی بدات، هەروەها نەمدەتوانی ئەندێشەی بکەم لەوێرانبوونی

کەسێکی دی، ئەوەی لە دەوروبەری دەبینرا نامەلەکی بــوو.. قــەت نــەدەبینرا –وام بــاوەڕە- مەلــەکی نەفسێکی دی، لەناو دڵی بووم وەك چۆن لــە قەســرێ کە لە دانیــشتوانەکەی چــۆڵ کرابــێ هــەتا چــاوم بــە مەخلوقێ نەکەوێ وەك تــۆ بــێ لــە هیــچی، ئــەوەی هەبوو ئەوەبوو، بەداخەوە، تــابعی ئــەو بــوو، بــەڵام علەت چی بوو کە بۆ ژیانی ڕماووی منی دەویــست؟ هیچ فەزلێکی بۆ زیاد نــەکردم.. ئەگــەر مــەرگم بــۆ نەهێنیێ! جار جارە خەم و قوڵپــەی گریــان دەیگــرتم و پێم دەگوت:"من لە تۆ دەگەم" وەڵامــی نەدەدامــەوە تەنها بەهەڵتەکانی شانی نەبێ.

❊❊❊

(ئابەجۆرە لەگەڵ نوێ بوونــەوەی خــەم و پــەژارەم بەبێ پچڕانەوە، زیادبوونی زەڵاڵەتم لە چاومدا، و لــە چاوما) هەرکێیەك هەیە با بفــەرموێ چــاوی ببڕێتــە من، ئەگەر حوکمی لەبیرچــوونەوەی ڕەهــام بەســەردا نەدرابا ئەو تێنوویەتیم زیاد دەبوو بۆ خێرو بێری ئەو، بەماچەکانی و باوەش تێهەڵێنانەکانی لەدڵەوەی، من بەڕاستی دەچوومە نــاو ئاسمــان، ئاسمــانێکی تاریــك، دەمەویست لەوێ وەك هەژار و کەڕوڵاڵ و کوێر تــەرك کرابام ، ئیدی دەستم پــێ کــرد ئولفــەتم پــێ گــرت،

هەردوو نەفسی خۆمانم وەك دوو منالّ دەدی کە لەناو بەهەشتی خەمدا جێهێڵرابن و یاری بکەن، لەگەڵ یەك رێکبووبن، بەنەشوەتەوە کارمان لەگەڵ یەك دەکرد، بەلاّم، دوای بەباوەش کردنێکی دلّبەر، دەیگوت: (دوای ئەوەی بە تەکییا ڕەت بووم، چەند بەلای تۆوە سەیرە، دوای ئەوەی لێت جیادەبمەوە، کە دەستی منت لە ژێر گەردن نامینێ و ئەو دڵەی من کە پەنای بۆدەبەی و ئەو غەمەی گلێنەت دەلێستەوە، هەردەبێ ڕۆژێ دوور برۆم، دەبێ لەوەشدا یارمەتی کەسانی دی بدەم.. ئەوە ئەرکی منە.. کە هەڵبەت من حەزم لەوەنیە ئازیزەکەم..) دوای جیابوونەوەی، یەکسەر هەستم بەخۆم کرد کە بوومەتە نێچیری سەرسامی، کەوتمە ناو ترسناکترین زولمەت و مردن، لەبەر ئەوە وادەیدا کە قەت جێم نەهێڵێ، نەك هەر ئەمە بەلّکو ئەو وادەیە وادەی عاشقان بوو، بیست کەڕەتان بەلاّم وادەی ئەوە هێندە لەڕبوو وەکو ئەوە بوو، کە من گوتم(تێت دەگەم)

❊❊❊

ئاخ قەت لەسەریا تووشی غیرە نەدەبووم... باوەڕم نیە کە جێم دەهێڵێ ئەدی لەپای چیبوو دەبێ؟ ئەو کەس ناناسێ.. قەت نایەوێ کاربکا ئەو دەیەوێ

وەکو ڕێبواری بمێنێ و خەوتبێ. ئایا موحیبەت و چاکی بەتەنها بەسە بینە جەوازێ بۆ واقیعی ژیان؟ لە هەندێ ساتدا ئەو زەوییە نەویە لەبیردەکەم کە بۆی دابەزیم.. خۆم شیدەکەمەوە هێزم پێدەبەخشێ.. کۆچ دەکەین و لە بیاباندا ڕەودەکەین، بەسەر شۆستەی ڕێگامانەوە لە شارەنادیارەکان دەخەوین.. بەسەرپەرشتی و بێ خەم، یاخود ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕادەبم و دەبینم نەرێت و یاساکان بە کاری سیحرەکەی نەماون و دونیا بەحاڵی خۆی بۆ ئالودەکان و دڵشادی و بێ موبالاتیم جێی هێشتووم، ئاخ ئەگەر پاداشتم بدەی، چەند ئازارم کێشاوە، سەبارەت بەو سەرکێشیەی کە کتێبی منالان وەسفی دەکات... بەڵام ناتوانێ و منیش نازانم غایەتی چییە. ئەو پێی گوتم کە دڵی حەسرەت و شەوقی تیایە: بەلام نابێ ئەوە ببێتە مەبەستی من، ئایا قسە لەگەڵ خوا دەکات؟ لەوانەیە دەبێ بۆ لای خوا بچم من لە قولایی چاڵدام.. ئیدی ناتوانم نوێژ بکەم..

****

(ئیدی خەمەکانی خۆی بۆ باس کردم... ئایا باشتر لە فشەبازییەکانی تێی دەگەم؟ ئەو لێم هەڵدەگرێ ، چەندین کات سەرف دەکا تا شەرمەزارم

بکات لـه هـەموو ئـەو شـتانەی کـە لەژیانـدا دڵـی مەشغول کردوم... جا ئەگەر بگریم ئـەوە مرومـۆچ و وەڕس دەبم.

*** 

ئەو جحێڵە ڕێکەت بینیوە کە دەچێتە ئەو ماڵـە کپ و جوانە، ئەوە پێی دەڵێن دیگال، یا دیفـور، یـا ئەرمان، یا موریس ،نازانم!

*** 

ژنێ دڵی خـۆی بـۆ ئـەو پۆخلـە گـەلۆرە سـەرف کردووە.. کوژرا، ئەو ئێستا بێ شەك قەدیسەیەکە لە ئاسمان... ئەو دەمرێنێ وەك چۆن ئەو ژنەی مرانـد... ئـەوە چارەنوسـی ئێمەیـە، ئێمـەی پیـاو چـاکان... بەداخـەوە لـە هەنـدێ ڕۆژدا خەڵکـە چـالاکەکان هەموویان ئەو فروفێلە دەبینن کە چـەند ئـارەزوێکی گەندە دەیانجولێنێ بە پێکـەنینێکی درێـژ و ترسـناك پێدەکەنێ، ئینجا دێتەوەو بەزەیی بەمندا دێتەوە وەك دایکێکی گەنج یا وەك خۆشکێکی خۆشەویست.. جا ئەگەر کەمتر وەحشی بـێ.. ئـەوە ڕزگارمـان دەبـێ، بەڵام لوتفەکەشی کوشندەیەو منیش لەناو دەستیام... وای بەر من، من شێتم.!

*** 

"ڕەنگە ڕۆژی لە ڕۆژان بە ئەعجوبە ون ببێ بەڵام دەبێ بزانم ئاخوو بۆ ئاسمان بـەرز دەبێتـەوە تـا شـتێ سەبارەت بەسەر هەڵگەڕانی خۆشەویست بزانم.

وای لەم وێڕابوونە!.

*** 

## وڕێنه (٢)

کیمیای وشه

وەلێ سەبارەت بەخۆم ها ئەوە شتێ لە هەوەسم:

زۆر دەمێکە شانازیم بەوە کردووە کە هەموو ئاسۆییێکی ژیان و خەیاڵم خستۆتە ژێر مشتی خۆم، جگە لە رق بوونەوەم لە ناو دارانی شیعر و هونەری ئەم چاخە هیچی دیکەم لە دڵدانەگرتووە.

***

زۆر بە تاسوقەوە بووم بۆ وێنەی قەڵپ و نەخشی سەر دەرگاکان و زەخرەفەی لیپۆك و تەوزیفی میللی و ئەو ئەدەبەی زەمەنی بەسەرداچووە و لاتینیەکانی کڵێساو کتێبی خراپەکاری تژی هەڵەی هیجا و حیکایەتی باپیران و داپیران چیرۆکی ئەجندان و

کتێبۆکەی منالآن و ئوپێرای کۆنینەو گۆرانی نەزۆك و ئاوازی کاڵ.

*** 

خەونم بەجەنگ و جیهاد و سەفەری کەشف کردنێك کە نەگێردراوەتەوە، ئەو کۆمارانەی مێژوویان نیەو ئەو شەرە ئاینیانەی سەرکوتکران و شۆڕشی نەرێت و تەقالید و گواستنەوەکاری میللەتان و قارەکان... باوەڕم بەهەموو سیحرە جوانەکانم هەبوو.

*** 

چەندین ڕەنگم بۆ پیتە بزۆزکەکان داهێنا! ئەلف ڕەشە، واو شینە یاو سوورە، هەروەها شێوەی پیتە بێدەنگەکانم چاکرد و حەرەکاتم بۆ کرد و بەئیقاعی غەریزی ، شانازیم بەوە دەکرد کە زمانێکی شیعری وام داهێناوە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەکەوێتە بەردەستی هەموو حەاسێك ، وەرگێڕان ماوەتەوە.

*** 

دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لە نیشتەگاو زولمەت.. هەموو ئەوانەم تۆمار کرد کە وەسف ناکرێن، هەروەها تۆماری سوڕگەی نەشوەکانم کردووە.

*** 

دوور لە مەل و مێگەل و گوندینیەکان

نەمدەزانی دەخۆمەوە، بەراکشاوی لەو خەلۆوەتە
لە نێوان درەختی بەندوقی تەڕوپڕ
*** 
لە تەمی چاخێکی فێنکی سەوز؟
ئاخر دەمتوانی چی بخۆمەوە لەو هەرەتانە
- درەختی دەرداری بێدەنگ، گیای بێ گوڵ، ئاسمانی مۆن-
لەناو ئەو کودیە شینە دوور لە هێلگە گونە ئازیزەکانم؟
شەرابێك لە زێر ئارقە دەچکێنێ.
*** 
من وەك لافیتەی مەیخانەیەکی بە گومان بووم
ڕەشەبایێ هەڵێکردوو ئاسمانی راماڵی لە ئاسماندا
ئاوی دارستان بەسەر لیم و باکیزەگیدا وون بوو
بای خودا زۆنگاوەکانی بەستەلەك باران کرد
*** 
لە کاتێك دەگریام، زێرم بینی، نەمتوانی بخۆمەوە
لە هاویندا خەوی عیشق
هەتا چواری سپێدە بەردەوام دەبێ
لە ژێر درەختی چڕدا بۆنی داوەتی ئێوارە دەهات
*** 

لەوێ لەو بازارگە فراوانەو
لە ژێر هەتاوی — هەسبرید-
پیشەکاران قۆڵ و باسکیان لێ هەڵماڵیوە
دەستیان بە بازرگانی کردووە.

❊❊❊

بێدەنگن لە بیابانی قەوزەییاندا
رادەکەن بەرەو ساپیتە جوانەکان
کە شار ئاسمانی قولابی دەنەخشێنێ

❊❊❊

ئاخ لەپێناوی رەنجدەران
رەعیەتە جوانەکانی شای بابلی
ئەی خودای ئەوینی عاشقان
خودانی دڵە تاجبەندەکان نەرم بکە

❊❊❊

ئەی شای شوانان
ئاوی ژیان بۆ پیشەکاران هەڵگرە
تا هیزیان بەسەلامەتی بمینێ
لە چاوەڕوانی مەلەی دەم دەریای نیوەڕۆیان

❊❊❊

دارشتەی شیعری کۆن، نەسیبێکی زۆری هەبوو لە ناو کیمیای زمانەوانیم.

لەسەر هەڵوەسەراهاتووم ، بەئاشکرا مزگەوتێکم بینی ، قوتابخانەیێکی دۆڵەنگێوانم بینی کە فریشتە دورستیان دەکرد، هەروەها چەند پەیتونێ ئەسپ ڕایاندەکێشا تێپەڕی ڕێگاکانی ئاسمانیان دەکرد و بەهوییێکیان لەبنی دەریاچە دەبرِی، ناونیشانی - فودفیلین — بەس بوو بۆ ئەوەی چەند تارماییێکی ترسناك لەبەرچاوم بورووژێنێ..

ئینجا سەفسەتەی سیحریم بەهەلوەسەی وشە راڤە کرد!

کۆتاییم هات، خەلەلی خۆم بینی کە ئەمرێکی موقەددەس بوو. من بێکار بووم..

نێچیری تاییێکی هەڵپڕژاو: کە ئێرەییم بەداوەران دەبرد لەنیعمەتی خۆیان، ئەو - مێکوتە- ی کە نوێنەرایەتی تەهارەتی عورفەکان و کەڵبەو خەویلکەی پاکیزەگی دەکرد!

سروشتم تیژ بوو، بەجۆرەها ڕومانسیەت بەدونیام گوت خودا حافیز.

# سترانی بەرزترین بورج

دەبا ئەو زەمەنە بێت.. بێت
کە عاشقی دەبین
وای چەندم سەبرگرت
قەت لەبیری ناکەم
ئازار و ترس
لەهەوادا بوون بەهەڵم
تێنوێنی پیس کراو
خوێنی شێلو دەکردم
دەبا ئەو زەمەنە بێت بێت
کە عاشقی دەبین
وەك مێرگێ فەرامۆشی بەسەر داخرا
شین بوو و

بەبخورو زیوان پەل و پۆی هاویشت
مێشێکی پیسیش ویزە ویزی بوو لە ناویا
دەبا ئەو زەمەنە بێت بێت.. بێت
کە عاشقی دەبین

*** 

عەشقی بیابان و بێستانی سوتاو و حانوتی لە بێنچوو و شەرابی قاچاغ بووم، لە کۆلانە گەنیوەکاندا سوالم دەکرد.. بە چاونوقاویەوە، خۆم بەخشیە خۆرەتاو ، خودای ئاگر...

***

ئەی ڕابەر ئەگەر مەترەلوزێکی کونینەت لە نێو قەلا رماوەکاندا ماوە، ئەوە بە بەرد بارانمان کە، شوشەی بازارە گەورەکان بەرد باران کە، ئەو هۆلەی کە تیایا دادەنیشن بەرد باران کە، خۆراکی خۆل بدە ئەو قەومە... ژەهر لە شەراب کە.. سەرینەکان بەبارودی یاقوتێکی داگیرساو تەژی بکە.

***

وای بەر ئەو پێشکەیە کە بەنەشوەتەوە بەسەر میزخانەی مەیخانەدا دەسوڕێتەوە ،
تیشکێ بەسە تا لەناوی بەرێ.

***

## برسێتی

ئەگەر حەزم بچیتێ
ئەوە حەزم ناچێتە هیچ جگە لە زەوی و بەرد نەبێ
خۆراکی من هەمیشە لە هەوایە
لە بەرد و ڕەژوو ئاسنە

❊ ❊ ❊

ئەی برسێتی بسووڕێ، ئەی برسێتی بلەوەڕێ،
بەسەر لەوەڕی پەلك و پار
لەو لقانەی کە سەرهەڵدەگەڕێن
شادی ژەهر دەرکێشە.

❊ ❊ ❊

هەموو وردە بەردە خاش کراوەکان
هەموو بەردەکۆنینەکانی پەیکەر:
پاشماوەی تۆفانن
نانێکی پەرش و بڵاون لە دۆڵێکی چەقێندا

***

گورگ لە ژێر چڵەکاندا لوراندی
تف لە پەڕی بریقەدار دەکات
دوای خواردنی مەلان:
من وەك گورگ دەسووتێم .

***

سەوزەوات و مێوەجات
جگەلەو کەسەی کە دەیانچنێ
چاوەڕوانی هیچ ناکەن
بەلاّم داپیرۆچکە
جگە لە عەوسەج هیچی تر ناخوات

***

دەبا بخەوم یا بسوتێم
بەسەر کوشتەی سلیمان دا
شۆربا رژایە سەر ژەنگ و
تێکەڵی دەریای مردوو بوو

لە کۆتاییدا، وای بۆ دڵخۆشیم،بۆ حیکمەتم، لازوردی ئاسمانم لادا، کە ڕەنگی ڕەشەو من ژیام.. تیشکەنەیێکی زێرینە، بەنوری سروشتی، لە دڵخۆشیمدا بەپێی توانام حوّم وێڵ و بێ شەرم خستەروو:

دۆزیمەوە!
چییە؟ ئەبەدیەت
کە دەریایەو تێکەڵی خۆر بووە
❊❊❊
ئەی ڕۆحی جاویدانیم
سەرەڕای گۆشەگیری شەوڕۆژی داگیرساو
پارێزگاری وادەی خۆت بکە
❊❊❊
بەمەش لە حوکمی بەشەرو سالأنی فیتنەم
ڕزگارت دەبێ
ئیدی بەپێی.... دەفڕی
❊❊❊
دورکەوە لە هیوا
نا **d'orietur**
زانست و سەبر
ئازار رەشە
❊❊❊
ئیدی سپێدەیەك لەئارادا نییە
پشکۆییکی ساو خۆش
داتدەگیرسێنی
ئەوە ئەرکی تۆیە.

دۆزیمەوە!
چییە؟ ئەبەدیەت
کە دەریایە تێکەڵ بە خۆربووە.

****

بووم بە ئوپێراییێکی ئەفسانەیی: بینیم خەڵکی هەمووی مەحکومە بە بەختەوەری ژیان: چالاکی ژیان نییە، بەڵکو شێوازێکە بۆ سەرپێچی کردنلە هێندێ هێز، تێکچونێکی عەسەبییە، رەوشتیش لاوازییێکە لە مێشك.

وام بۆ بەدیار کەوت کە هەر مەخلوقێ هەقی چەند شتێکی تری زیندووی هەیە، ئەو گەورە پیاوە نازانێ چی دەکا: ئەو مەلاکە، ئەم خانەوادەیەش زورپەتی سەگە. لەبەرابەر زۆر لە مرۆڤاندا بەدەنگی بەرز قسەم کردووە، لەگەڵ ساتێك لەیەکێ لە زیندووەکانی دیکەیان قسەم کردووە- ئینجا پاشان بەرازم خۆشویستووە.

هیچ یەکێ لەم سەفسەتەی شێتیم خافڵ نەکردووە، ئەو شێتایەتیەی کە حەبس دەکرێ- لە برستم دایە کە هەموویان بڵێمەوە، من رێگەکەیم لەبەرە.

****

تەندروستیم تووشی مەترسی هات. وادەی ئیرهاب هات. منیش لەو خەویلکەدا دەکەوتمە خـوارەوە، کـە چەندین ڕۆژی دەخایاند، کە هەڵدەستام ئـەوە خەونـە زۆر خەمبارەکانم نەدەپچڕان، بۆ مەرگ پێگەیـشتم.. لاوازیم ڕابەری کردم لەو ڕێگایەی کـە پـڕی بـوو لـە هیلاکی بەرەو مەرزی دونیاو —سیمیریە- نیـشتمانی زوڵمەت و ڕەشەبا.

***

دەبوایە کۆچ بکەم، تا هەموو ئەو وەسوەسەیە لـە زەینمدا ڕەهاکەم کە فریو کۆدێتای لەسەر کردبوو، لە ناوەندی دەریادا کە خۆشم ویستووە، وەك چۆن ئەوەی لە نەگـبەتی و پیسی پاکم کاتەوە، ئیـشراقەی خاچـم بینیوە بەخشندەی دڵدانەوە ، ئایشەو فاتمێ بوون کـە نەفرەتیان بۆ هێنام، بەڵام خۆشی قەدەری حەتمی مـن بوو، کرم و وەسوەسەم بوو، ئیدی ژیانم هەمیشە پڕترو فراوانتر دەبێ لەوەی بۆ هێز و جوانی تەرخان کرێ.

***

وای لـەم خۆشـییە! کـە کەڵبـەی جـوانی خـۆی لەکاتی مـەرگ بـۆمن دەرهێنـا، لـە سـاتی بـانگی کەڵەشێر. لـە **maturtinum** هـەتا **christus venit** لـە تاریکترین شاردا:

ئەی وەرزەکان، ئەی کۆشکەکان
کام نەفس بێ عەیبە؟
لێکۆڵینەوەیێکی سیحریم کردووە
بۆ بەختەوەری حەتمی
هەموو جارێ کە کەڵەشێری باشور دەخوێنێ
سڵاوی لێ بێ
ئاخ شەهوەتم بۆ نامێنێتەوە
چونکە ئەو ئەمری منی گرتە دەست
سیحر کۆنترۆڵی کردووم و
هەموو هەوڵێکی ڕەواندەوە
ئەی وەرزوکان. ئەی کۆشکەکان
سەعاتی راکردن هاوارتە لەمن!
سەعاتی مەرگی منە
ئەی وەرزەکان. ئەی کۆشکەکان!

* * *

هەموو ئەوانە ڕابردن، ئەمڕۆکە فێری سڵاوی جوانی بووم.

مەحاڵ

ئاخ بۆ ژیانی منداڵیم، ئەو ڕێگایەی لە هەموو لایەکەوە بۆی دەچن، سەنگینە بەسەر سروشتەوە،

پاكناختره له بەخێرترین سوالكەر ، شـانازی بـەخۆی دەكات سەبارەت بەوەی له نیـشتمان و هـاوەڵان ڕوت بۆتەوە، وای ئەم ژیانه چەند گەمژەڵـە. هـەر ئـەمڕۆ دەركم بەوەكرد!

***

ـ من لەسەر هەق بووم سـەبارەت بـەقێزەونكردنم لەو قەومەی كه هەلێك له دەست نـادەن بـۆ مـاچ و باوەش پیاكردن، بوونەتـه مـشەخۆر بەسـەر پـاكی و گەشـێتی ژنـەكانمان، ئەوانـەی ئەمڕۆكـه ئەوانـه لەگەڵماندا كەمتر ڕێكەوتنیان هەیە.

***

مـن لەسـەر هـەق بـووم سـەبارەت بـه هـەموو ڕقبوونەوەكانم مادەمەكیێ: من ڕامكرد!

ئایا من ڕامكردووە.

لێگەڕێن با بۆتان ڕاڤەكەم.

***

دوێنێ، هەناسەی ساردم هەڵدەكێشا: (وای كـه ئێمـه ئـاپۆڕەیێ لەمەلعونـەكانی دونیـاین، مـن زەمـانێكی درێـژه لـه زومـرەی ئـەوانم. هـەموویان دەناسم. هەریەك لەئێمه ئەوی دیكه دەناسێ، هەریەك له ئێمه خـۆی لـەویتر بـەدوور دەگـرێ. هـەموومان

نەشــارەزاین لــە خۆشەویــستی ، بــەڵام بەئــەدەبین:
پەیوەندیمان لەگەڵ خەڵکانی دیکە گەردی لەسەر نیە)
ئایــا ئــەوە شــتێ دەوروژێنــێ؟ خــەڵك، بازرگانــان،
خورتەکان- لەکــەی شــەرمەزاریمان پێوەنیــە- بــەڵام
پاڵاوتەیەك لە هەڵبژاردەین، چۆن پێشوازیمان دەکــەن؟
چەند جەفا کار و دڵخــۆش لێــرە هــەن، هەڵبــژاردەی
قولابی هەن، مادامەکێ نزیکبوونەوە لەوانە پێویستی
بــە جەســارەت و زەلیــل بــوون هەیــە، تــەنها ئــەوان
هەڵبژاردەن، ئەوان لەوانەنین، کە بەرەکەت دەبەخشن.

***

ئێستێکە دوو درهەمی حیکمەتم بــۆ گەڕایــەوە،
ئــــەوە ئەوەنــــدە درێــــژ ناخایــــانێ- سەرچــــاوەی
ماندووبوونی من ئەویــە کــە لــە ڕۆژاوا دەژیــن مــن
ئێستاکە وادەبینم کــە پێــشتر بــۆی نەچــووبووم، لــە
زۆنگاوەکانی خۆرهەڵات، ئەوە لەبەر ئەوەنیە کە مــن
وام باوەڕە ڕوناهی پیس بووە، قالبەکە هەڵهەلەیــەتی،
بزاڤەکــە لــەرێ لایــداوە...باشــە، ئــەوەتا زەیــنم بــە
پیلەکردنەوە داوادەکا کە ئەمری پەرەســەندنە تونــدو
تیژەکان هەمووی بگرێتە دەست، کە لەو کاتــەی کــە
ڕۆژهەڵات داڕماوە ڕۆحی وەبەرهاتووە ، زەینــی مــن
زۆر بە تاسوقەوەیە، هــا ئــەوە هــەردوو درهــەمم لــە

حیکمەت تەواوبوو!-  ڕۆح زاڵمێکەو دەیەوێ هەر لە ڕۆژاوا بمێنمەوە دەبێ هەناسەی بگرم تا ئەو شوێنەی کە دەمەوێ کۆتاییم دێ.

***

تاجە گوڵی شەهیدان و ڕوناهی هونەر، شانازی داهێنەران و شەوتی تاراجکەرانم ناردە دۆزەخ، گەڕامەوە ڕۆژهەڵات بەرەو یەکەم حیکمەتی ئەبەدی.

- بەڵام وا بەدیاردەکەوێ کە ئەو خەونە تەمبەڵ و خاوە!

لەگەڵ ئەوەش دڵی خۆم بە لەززەتی سەرسورانی شەقاوەی چاخ خۆش نەکردووە.

***

ـ ئایا بەڕاستی هیچ ئازارێ لە ئارادا نیە، هەر لەکاتی ڕاگەیاندنی ئەو عیلمە، مەسیحیەت، مرۆڤ یاری بەخۆی دەکا، بۆخۆی ئەو شتانە دەسەلمێنێ دەکا کە پێویستیان بە سەلماندن نییە، لەزەت لە دووبارە بوونەوەی ئەو سەلماندنە وەردەگرێ، تەنها ئاوا دەژی؟ ئازاردانێکی ناسکی گەمژەڵ، ئەوەش سەرچاوەی قولابکاری و زەلالەتی منە، لەوانەیە سروشت وەڕەسی بگرێتە دەست، لەوانەیە! (برودوم) لەگەڵ مەسیح لە دایک بووە.

***

ئایا لەبەر ئەوەنیە کە ئێمە تـەم دەچـێنین، ئێمـە لەگەڵ سەوزایی دا- تا - هەڵدەلوشین، ئەی لەبارەی مەی، توتن، جەهل و قوربانیدان! ئایـا هـەموو ئـەو شتانە لە حیکمەتی ڕۆژهـەڵات غـەریبن- یەکـەمین پێگە- ؟ دونیاییێکی هاوچەرخمان بۆچـیە مادەمـەکی ژەهرێکی وا دادەهێنرێ!

***

کاهینەکان دەڵێن، تێگەیشتین، بـەڵام مەبەسـتت بەهەشتی عەدنە. لە مێژووی گەلانی ڕۆژهەڵات! شتێ نادۆزیەوە بەکەڵکت بێـت . ئـەوەش هەقـە ئەمـەیان بەهەشـتێکە نەمدەویـست، تـەهارەتی پێـشینان چ سودێکی بۆ من هەیە.

***

فەیلەسوفەکانی دەڵێن: دونیا عومری نیە، ئەوەی لە ئارادایە ئەوەیە کە مرۆڤایەتی دەگوازرێتـەوە، تـۆ لە ڕۆژاوای، بەڵام تـۆ ئـازادی کـە لـەو ڕۆژهەڵاتـەدا بیتکەگەرەکتە.. هەرچەند قـەدیم بێـت. بـەڵکو تیـا سەقامگیر دەبیت، نەکەن تەسـلیمی ژێرکـەوتن بـن، ئەی فەیلەسوفەکان ئێوە لەناخی ڕۆژاوان.

***

ئاگاداربە.. ئەی زەینم، لەپێناو ڕزگاریدا دوور بە لەتەگبیری دژوار، زەندی خۆ داچنە، بەداخەوە بۆ سستی هەنگاوی زانست!

***

بەڵام تێبینی دەکەم کە زەینم شەوزیکری کردووە.

***

ئەگەر ئەو لەو ساتەدا بەبێداری مابوایەوە، ئەوە دوای کەمێکی دیکە دەگەیشتینە حەقیقەت، کە لەوانەیە خۆی و فریشتە گریاوەکانی بەدەورمانەوە بسورێنەوە!...

***

ئەگەر تا ئەوساتە بەبێداری مابوایەوە ئەوە تەسلیم نەدەبۆوە.. هەر لە زەمانێکی زۆر دورەوە ئەو ئالودە دژوارانە، ئەگەر هەمیشە بێداربوایە، کەواتە لەناو دەربای حیکمەتدا مەلەم دەکرد

وای لەم سەفایە!سەفا!

هەر ئەو ساتەیە لە بێداریکە دیدگای سەفای پێ بەخشیم

- بەرۆح دەگەیتە خوا

بەختێکی خەواڵو!

تروسکە

کاری مرۆیی! ئەو تەقینەوەیە کە بۆ ماوەیەك شەوی تارم ڕووناك دەکاتەوە.

*** 

(هیچ شتیّ بیّ هودەیی نییە: بەرەو زانست، بەرەو پیّشەوە! کاهینی هاوچەرخ ئاوا بانگەشە دەکات... واتە هەموو خەڵك... لەگەڵ ئەوەشدا تەرمی شەڕاوی و تەمبەڵەکان بەسەر سینەی ئەوانی دیکەدا کەوتوون، ئاخ پەلەکەن تۆزیّ یارمەتیم بدەن، لەویّ بە نیّو تاریکیدا تۆبەی ئەبەدی چاوەڕوانمان دەکات... ئایا لەدەستی بدەین؟)

*** 

ـــ دەتوانم چی بکەم؟ شارەزای کاربووم، هەنگاوەکانی زانستیش لەسەر خۆن، لەسەر خۆن، بەڵام نویّژ رادەکا و ڕووناهی زەنایەتی ، ئەوەیان چاك دەزانم ئەوەیان کاریّکی ئاسانەو قرچەی گەرمایە، دەبا لە من گەڕیّن ئەرکی خۆم هەیە وەکو زۆر کەس شانازی بەخۆم دەکەم بە وەلانانی.

*** 

ـ ژیانم کلۆڵ بووە، دەی وەرن! با خۆمان سست و گیّل بین، وای لە خۆمان! ئینجا بە فشە دەژین و

خەون بە شەوقی ترسناك و دونیای گەش دەبینین، سەرکێشی دەکەین، لیپۆکەکان و سوالّکەران و هونەرمەندان، ڕێگرەکان هەموو یەکتری ورد و خاش دەکەین بەدەوری ڕووکارەکانی کەون! بەسەر بالینگانی نەخۆشیەوە، بوخورێکی بۆنداری بەهێزم بۆ هاتەوە، پاسەوانی چاکەی موقەددەس، کورسی دان پیانان، شەهید.

***

من لەوەدا دەبینم کە لە منداڵیدا خراپ پەروەردە کراوم،پاشان چی؟ ئایا لە بیستدا بڕۆم کە لە عومری بیستدا خەڵکی دیکە دەڕۆن.

***

نەخێر... نەخێر! من ئیمڕۆکە تووڕەو سەرکێشم لە مەرگ! کارەکە ئاسانترە لەوەی کبریائم پێی ڕازی بێ، خیانەتی من لە دونیا وا لێ دەکات، کە ببێتە ئازارێکی کورت خایەن. لە دوا ساتەکان... چەپ و ڕاست تاراج دەکەم.

***

_ ئاخ _

بەمە... ئەی نەفسی ئازیز و پەڕپوتم، ئەبەدییەت بەخەسار نادەین!

## سپێدە

ئایا ڕووی نەداوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان من کوڕێکی قۆز و هەمیشە لە ریزی پێشەوە دابووبم، سیرەتی مەزنی خۆی بەسەر چەند لاپەڕەیەکی زێڕیندا دێربەند کردبێ، بەختی زۆر بووبێ! باشە چ خراپەیەکم کردووە و چ هەڵەیەکم ئەنجامداوە، ئاوا بەم جۆرە موستەهەقی گلانی ئێستەبم. ئەی ئەو کەسانەی دەڵێن کە ئاژەڵان فرمێسکی کارەساتییان لە گلێنە دێتە خوارەوە، هەندێ نەخۆش تووشی نائومێدی دێن و مردووەکان بە خەونان وەڕس دەبن، هەوڵ دەن چیرۆکی ڕمان و خەوتنم بگێڕنەوە، بەڵام من باشتر لە سواڵکەرێ نازانم گوزارشت بکەم کە ورتەورتی تەواو نابێ، خودایە، ئەی مەریەم، چیتر ناتوانم قسە بکەم!

****

بەوەی کە وام باوەڕە ئەمڕۆکە چیرۆکی دۆزەخی خۆم تەواو کردووە، بەڕاستی دۆزەخ بوو، دۆزەخی قەدیم، ئەو دۆزەخەی بەنی مرۆڤ دەرگاکانی کردەوە.

****

لە خودی بیابان بۆ خودی شەو، هەمیشە چاوی کز بەسەر ئەستێرەی زیویندا دەبێتەوە، بێ ئەوەی پاشاکان ژیانی خۆیان پێوە هەڵدەنەوە، هەرسێ ئەو مەجوسە. ـ دڵ و ڕۆح و زەین ـ ئاخر کەی شاد دەبین تا ئاهەنگێ سازکەین ؟ لە پشت چەقێن و گردۆڵکەکانەوە بە لە دایکبوونی کاری تازەو حیکمەتی تازە، بە بەزینی زاڵم و ئیبلیسەکان، بە کۆتایی هاتنی قسەی قۆڕ، لەسەر زەویدا، بەر لە هەموان ئاهەنگ بگێڕین- بەبۆنەی جەژنی لەدایک بوونی زەوی ؟

****

بالۆرەی ئاسمانەکان، پێشکەوتنی گەلەکان، ئێمەی کۆیلەکان، نابێ نەفرەت لە ژیان بکەین.

# مالاوایی

ئایا پاییز هاتووە! بەڵام بۆچی داخی خۆرەتاوی ئەبەدی دەخۆین، مادامەکێ ئێمە لە ڕێگەی کەشف کردنی ئەو دەرکەوتە گەشەی خوداوەندییەین،- دوور لەوانەی کە لە کۆتایی وەرزەکانەوە دەمرن.

❋ ❋ ❋

پاییز... بەلەمەکەی پێشانمان لە ناوەندی تەمی وەستاودا بەرەو بەندەری شەقا لادەدا، ئەو شارە فراوانەی کە ئاسمانێکی هەیە بە ئاگر و چڵپاو پیس بووە، ئاخ جلوبەرگی ونجڕونجڕ، نانی تەڕ بە باران و شەراب و هەزاران لەو شەوقەی کەلە خاچی داوم، بەڵام هیچ کۆتاییەك نییە بۆ ئەو دێوەی شای مەلایین ڕۆح و جەستەی مردوو، کە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری لێدەکرێ! دەگەڕێمەوە و خۆم دەبینم پێستم

به سیان و تاعوون خوراوه، کرمیش له ناو سەرو بـن هەنگلم دەلەوەڕێ لەگەڵ کرمی گەورەتر له دلما که له میانی دوو نادیاردا درێژ بۆتەوه هیچ عومرێکیان نییەو هیچ سۆزێکیان نییه.لەوانەبوو بەوه بمرم ، وای لەم هیلاکییه،

له کلۆڵیان موچڕکم بەلەش دادێ.

*** 

له زستان دەترسم چونکه وەرزی حەسانەوەیەدا.

***

ـ جارجاره له ئاسماندا هەندێ کەنار دەبینم کۆتاییان نییه، تـژی نەتەوه سپیه دڵخۆشەکانه، لەسەرووی خۆشمەوه کەشتیی یەکی زێڕینی گەوره دەبینم، بەیداخه ڕەنگاو ڕەنگەکەی لەگەڵ شنەی سپێدەدا دەلەرێتەوه. که جەژن و تاجەگوڵینەو هەموو دراماتێکی داهێنراو هەوڵ دەدەن گوڵی تازەو ئەستێرەی تازەو جەستەی تازەو زمانی تازه بەرهەم بهێنن. وام حسێب کرد که من بڕستی تازەم وەدەست هێناوه، ، ئێستێ پێویسته لەسەرم که من خەیاڵ و یادگاریەکانی خۆم له گۆڕنێم، شانازی شاعیر و حەکایەتخوانێ کەڕەشەبا پەرش و بڵاوی دەکاتەوه.

***

من، منم وام دانا كه عەرراف و فريشتەم، من له هەموو دەستوری رەوشت بوراوم، ها ئەوه من كەوتمە سەر زەوی و ئەركێك لەبەردەمماية هەولّی بۆ دەدەم ، هەروەها واقیعێكی دژاواره و دەبێ لە باوەشی بگرم! جوتیار!

***

ئايا فێڵ له خۆم بكەم؟ ئايا لەگەڵ موحیبەتدا لەبێن دەچم؟

باوابێ، داوای لێبوردن دەكەم كه بەزەلالەت قوتی گرتووه، وەرن .

بەلاّم هیچ دەستێكی دۆست نیه! لەكێ داوای یارمەتی بكەم؟

بەڵێ سەردەمی تازه لانی كەم زۆر توندو تۆڵه

***

دەتوانم بڵێم من سەركەوتنم بەدەست هێناوه، جیرەجیری ددان، نێڵەنێڵی ئاگر، هەنسكی ساردی قێزەوەن هێوردەبنەوه، یادگاره قێزەوەنەكان هەموويان لەبێن چوون، حەسرەتەكانی كۆتاییم خوران و لەبێن چوون، ئێرەییم سەبارەت بە سوالكەرو ریگرو هاورێكانی مەرگ و پاشكەوتووەكان - له هەموو

جۆرێ — هەی مەلعونینە، چ دەبێ ئەگەر تۆڵەتان لێ بکەمەوە.

❊ ❊ ❊

دەبێ ئێمە هەموو هاوچەرخانە بین.

❊ ❊ ❊

هیچ بەستەیەك نییە، دەبا خۆمان بەوە بگرینەوە کە وەدەستمان هێناوە، شەوێکی دژوارە. خوێنی وشك، جگەلەو درەختە کرێتە، بەسەر ڕوخسارمەوە دوکەڵ دەکات نەك دواوەم.. بەڵێ جەنگی نەفس لە جەنگی مرۆڤ کەمتر نییە لەرووی وەحشەتەوە؟ بەڵام بینینی عەدالەت بە تەنها چێژی خودایە.

❊ ❊ ❊

ئێمە هێشتاکە لە ئێوارەین.. دەبا هەموو نەفخەکانی هێز و غەریبی حەقیقی لەکاتی شەفەقدا وەرگرین، بەچەکەوە، بەسەبرێکی داگیرساو دەچینە ناو شارە گەش و کراوەکان.

پێویستی چیم بەدەستی دۆستێ هەیە؟ خەسڵەتێکی مەزنە، لە توانامدا هەیە بەشەوقە درۆزن و کۆنینەکان پێبکەنم..ئەو ژن ومێردە درۆزنانە شەرمەزار بکەم، لەوێ دۆزخێ ژنانم بینی؟

❊ ❊ ❊

- ئێستە مەودام دەبێ کە حەقیقـەت بـە ڕۆح و جەستەوە بکەم بە مولکی خۆم.

ئەبریل - ١٨٧٣

- رامبۆ له ١٨٥٤ لەشارلفیل ی فەرەنسی لەدایك بووه.
- له ١٨٧٣ بەتەواوی له ئەدەبیات دابڕاوه .
- لــــه ١٨٧٨ چـــۆته قـــوبرس پاشـــان چـــۆته ئەسكەندەریه و عەدەن و گەلێ وولاتی دیكه.
- لەساڵی ١٨٩١ لەتەمەنی سی و حـەوت سـاڵێدا كۆچی دوایی كردوه.
- ژیانی ئەو شاعیرە پڕ بووه له سەركێشی و كۆچ و رووداو، شیعرەكانیشی رەنگدانەوەی ژیـانی خـۆی بووه، شیعر لای ئەوتۆماری تایبـەتی خەونـەكانی بووه،زمانی شیعری ئـەو لەگـەڵ حـەواس تێكـەڵ بەیەكـــدەبوون، رەمزیـــەت بەشـــێكی گرینگـــی شیعرەكانی بووه.
- **وەرزێك له دۆزەخ** —وەرگێڕانی رەمسیس یۆنان.